# FLASH MX 2004

نوسەر: Kurdo

ئەرشیفی فێرگەی هەموو بۆ کوردان

All4kurds.Net

2007

ئەرشیفی بابەتەکانی فێرگەی هەموو بۆ کوردان

Flash MX چیە؟!

نووسەر: @:

وەکوو بڕیار بوو لە بابەتی ئەم جارەمان باسی ئەوە بکەین کە چۆن بتوانین ئەستێرەیەك دروست بکەین بە دەوری خۆی یان بەدەوری ئەستێرەیەکی تردا بخولێتەوە لە بەرنامەی فلاش .
بەڵام وەکو ئەزانین ئێمەی کورد تازەین لە ئینتەرنێت یان لە بەرنامەکانی کۆمپیوتەر. جا بۆیە ئەبێت کارێکی وا بکەین پێشی ئەوەی دەست بکەین بە بابەت نووسین دەربارەی چۆنیەتی فێربوونی بەرنامەکان.
ئەبێت کارێکی وا بکەین کە رووکاری بەرنامەکە بە خوێنەرانی ئازیزی کورد بناسێنین و بزانین ئەو بەرنامەیەی کە ئێمە ئەیخوێنین بۆ چی مەبەستێك بە کار دێت ؟ ئایا ئەتوانین سوود لەو بەرنامەیە وەر بگرین ؟
ئەمانەو چەندان شتی تریش.
ئەبوایە لە سەرەتای وانەی یەکەمەوە من ئەم کارەم بکردایە بەلام ئێستاش وابزانم ئەو کارە بکەین باشترە دوایی دێینەوە سەر ئەو بابەتانەی ترمان واتە بەکار هێنانی بەرنامەکە. بە شێوەیەکی تەواو پوخت بۆ ئەوەی خوێنەر یان ئەو کەسەی کە ئەیەوێت ئەو بەرنامەیە فێر بێت هەست بە بێزاری نەکات لە کاتی خوێندن و هەوڵدانی خۆیدا.
بەرنامەی ( FLASH MX 2004).
ئەم بەرنامەیە یەکێکە لەو بەرنامانەی کە بە بەهێزترین داهێنەری (Multimedia ) دا ئەنرێت ئەو مەبەستانەی کە ئەم بەرنامەیەی بۆ بەکار دێت یەکجار زۆرن و گرنگترینی ئەوانە وەکوو.
1- دروست کردنی فیملی فلاشی ڤیدیۆی جۆراو جۆر.
2- دروست کردنی فیلمی کارتۆن.
3- مۆنتاژو وەرگێرانی فیلم بە تێکست بۆ زمانێکی تر وەکو ئەوانەی لە تلفزیون ئەیبینین لە خوارەوەی شاشەکە بە نووسین ئەنوسرێت .
4-جووڵانی هەموو جۆرە وێنەیەك گۆرینی باری وێنەکان کرداری ( alpha) لەسەر وێنەو تێکستەکان.
5- دروست کردنی ڕێکلامی تلفزیونی.
6- تێکەل کردنی فیدیۆ لەگەڵ ئەم بەرنامەیەو دەستکاری کردنی فیلمی فیدیۆ .
7- خستنە سەری دەنگ بۆ هەر شوێنێك کە بمانەوێت لە فیلمێکدابە شێوەی زۆر وورد و ئالۆز.
8- دروست کردنی وێبگە لە ئینتەرنێت دا کە وەکو ڤیدیۆ دەر ئەکەوێت لەسەر وێبگەکان بە شێوەیەکی زۆر جوان و نایاب .
تێبینی ///// گرنگترین شت لە فلاشدا کە بەدی ئەکرێت ئەوەیە کە کاتێك فیلمێك دروست ئەکەیت لە فلاشدا وە هەروەها فایلێکی دەنگیشت تێدا بەکار هێناوەوەکو گۆرانیەك یان دەنگی خۆت تۆمار کردوە یان هەر فایلێکی تر . ئەگەر فایلە دەنگیەکە بۆ نمونە ( 4 mb) بێت واتە 4 میگابایت بێت ئەوا کاتێك لە ناو فلاشدا بەکاری دێنی یەکسەر قەبارەی فایلە دەنگیەکە کەم ئەکاتەوە ئەیکاتە نزیکەی (700kb) کەواتە چەندەها هەزار جار فایلەکە بچوك ئەکاتەوە بێجگە لەوەی کە وێنەو شتی تریش بەکار دێنیت.
تێبینی ///// ئاگاداربە فلاش تەنیا ئەتوانێت ئەو دەنگانە کار پێ بکات کە بە شێوەی (mp3) ە واتە گەر ویستت هەر دەنگێك بخەیتە ناو فلاش لە رێگەی (import)ەوە ئەگەر (mp3) نەبێت ئەوا ناتوانی بیخەیتە ناو فیلمەکەوە .
بۆ ئەوەی بزانیت جوانی وهونەری فلاش چیە ئەوا سەردانی ئەم بەستەرانەی خوارەوە بکە کە بە فلاش دروست کراون بۆ ئەوەی بۆت دەرکەوێت کە Flash MX شایانی ئەوەیە کە چۆنیەتی بەکارهێنانی فێربی یان نە؟!

http://www.hotplum.com/flash-templates/t30/index.html
http://www.hotplum.com/flash-templates/t24/index.html
http://www.hotplum.com/flash-templates/t19/index.html

ئەوانە و زۆر کاری دیکەش.
ئەم بەرنامەیە چەند ساڵێکە لە پێشکەوتندایە کە لە لایەن کۆمپانیای ( Macromedia ) وە دروست کراوە کە کۆمپانیایەکی ئەمریکیە , زۆر کۆمپانیای تر هەن کە ئەیانەوێت بەربەرەکانی لەگەڵ ئەم کۆمپانیایە بکەن بەڵام ناتوانن خۆیان لە شانی ئەم کۆمپانیایە بدەن .
ئەم ناوانەی خوارەوە بەشێکن لە ئەندازیاری ئەم کۆمپانیایە .
Paula Deili -1
Gory Hooper -2
Colm Mckeon-3
ئەمانەو چەندەهای تر .
بەرنامەی فلاش چەند وەشانێکی هەیە( version) لەوانە (1,2,3,4,5) بەڵام وەشانی (6) پێی دەوترێت ( Macromedia flash player MX 2004) . وەهەروها دواترین وەشانی ئێستا بریتیە لە وەشانی حەوتەم. بەڵام ئەوەی ئێمە باسی لێ دەکەین بریتیە لە وەشانی

شەشەم.
هەر یەکێك لەوانەی پێشووش چاکی و خراپی خۆیان هەبوە بەلام شەشەم ئیستا بە باشترینی هەموو ئەوانەی پێشی خۆی دا ئەنرێت بەڵام لە ماوەی بەکار هێنانی مندا چەند شتێکم تێبینی کردوە کە لە فلاش 5دا هەیە باشترە لە فلاش ام اکس هەرچەندە ام اکس لە فلاش 5 نوێ ترە بەلام وەکو ووتم چەند شتێك هەیە لە فلاش 5 باشترە لە فلاش ام اکس، ئەوەش لە کاتی خۆیدا باسی ئەکەین پشتیوان بە خوا.
ئێستا دێین و سەیری وێنەی ژمارە ( 1) ئەکەین ڕووکاری بەرنامەی فلاش ام اکس ئەبینین.
تێبینی / ئاگاداری بەشەکانی پرۆگرامەکە بە ڕەنگی جۆراوجۆر دیاریکراون و بەپێی ئەو ڕەنگانە پرۆگرامەکەتان پێدەناسێنم.




1- ئەو ناوچەی لاکێشەی رەنگی سوری لە دەورە پێی ئەلێن (Time line) ئەوانەی کە ئەکەونەناو ئەو بەشەوە بریتین لە:
Frames -
layers -
Time line-
2- ئەو بەشەی کە لاکێشەی رەنگی شینە پێی دەگووترێت (Tools) لەوێدا ئەتوانین پێنووس بهێنین بۆ وێنە دروست کردت یان دەستکاری وێنەکان بکەین گەورەو بچوك و یان بۆ تێکست نووسین کە هەموومان ئەزانین ووشەی (A) لە زۆربەی یان ئەتوانین بلێن لە هەموو بەرنامەکانی کۆمپیوتەر بەکار دێت بۆ نووسینی (تێکست) لێرەش بە هەمان شێوە ئەتوانین ئەوە بەکار بهێنین بۆ نووسین لە ناو شوێنی کارەکەمان.
3- ئەوەی کە بە چەند لاکێشەیەکی زەرد دیاریکراوە ئەوە شوێنی کارەکانمانە هەموو کارەکان لە وێدا جێ بەجێ ئەکەین وەکو کێشانی وێنە یان نووسین یان گۆرانکاری لەوێنەکان و ............ هتد .
4- ئەو شوێنەی بە رەنگی وەنەوشەیی رەنگ کراوە دوو ناوچەی جیاوازی تێدا هەیە:
یەکەمیان پێی دەگووترێت (action frame) کە ئەوانەی لە فێربوونی سەرەتایین پێوستیان بەم بەشە کەم هەیە یاخود بلێین هەر نیە.
دووەمیان پێی ئەلێن ( properties) ئەم بەشەیان پێویستە بزانین هەرچەندە شتێکی زۆری تیا نیە بەلام گرنگی پێ بەی باشترە, لەم بەشەیان چەند شتێك ئەبینین لەوانە ئەبینین نووسراوە (550×400) pixels ئەمەیان درێژی و پانی شوێنی کارەکەمان دیار ئەکات یاخوود بلێین بەرزی و پانیەکەی (width, height)، وە هەروەها لە شوێنێکی تر ئەبینین هەر لە خوار درێژی و پانیەکەمانەوە کە دیاریمان کرد نووسراوە (Flash player 6) ئەتوانین کرتەیەك لەسەر ئەوە بکەین و سەیری وێنەی دووەم بکە!




ئـەم شـێوەیەمان بـۆ دەر دەکـەوێت, سـەیر ئـەکـەین لـە وێنـەی ژمـارە 2 دا بـە ڕیـز نووسـراوە (Flash player 2, flash player1, ................هەتا دەگاتە6 ) ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە فلاش ام اکس ئەتوانێ ئەوانەی پێشوی خۆی هەموان بە کا ربهێنێت تۆش بە ئارەزووی خۆت یەکیان هەڵبژێرە بەڵام وا چاکە هەر 6 بێت. لەهەندێك کاتدا چاکترە 5 بەکار بهێنی ئەوەش بەپێی تاقیکرد نەوەی خۆم.
بەڵام هیچ یەکێك لەوانەی پێشو ناتوانن ئەو بەکا بهێنن.
وە هەر وەها هەر لە وێنە 2 دا دەبینین چەند هەڵبژاردنێکی تر هەیە وەکوو:
نووسراوە (Audio stream mp3, 16kbps.mono) هـەروەها لـە دەستی راستیشەوە (set) ئەمـە بـۆ کاتێك بـە کـار د ێت کە فایلێکی دەنگیت هێناوەتە ناو فیلمەکەوە ئەتەوێت (کوالیتی ) ئەو دەنگە ڕێك بخەیت.
واتە ئایا ئەتەوێت دەنگەکە ساف بێت یان نا ؟؟ بەدڵنیایەوە ئەگەر بتەوێت کارێکی وا بکەیت کە دەنگەکە زۆر ساف و ڕێکو پێك بێت ئەوا قەبارەی فایلەکە(size) زۆر گەورە دەبێت. ئەوەش کارێکە کە ئێمە نامانەوێت زۆر گەورە بێت.
لە هەموو کاتەکاندا وا با شە ئەگەر بتەوێت ئەو فیلمەی کە دروستی ئە کەی وە کو دیاریەك بۆ هاورێییەکت یان بۆ کەسێکی تری بنێریت لە ڕێگەی ئیمەیلەوە ئەوا وا چاکە یان (16kbps) بەکار بهینی یان (8kbps) ئەمیان باشترە چونکە قەبارەی فایلە کە زۆر بچوك ئەبێت و دەنگەکەشی باش ئەبێت.
دیسانەوە ئەگەر سەیری (properties) بکەین ئەبیینین لەناو لاکیێشەیەکی بچوکدا ژمارە (12) نووسراوە (12 frame pare) . (12fps second) واتە خێرایی فیلمەکەی کە دروستی ئەکەین.
لە یەك چرکەدا (12) ئەروات کە ئەوەش سیتسمی نەگۆرە بۆ زۆربەی فیلمێك واتە فیلمی سادەکان کە ئەیان بینین. بەلام ئێمە ئەتوانین بە ئارەزووی خۆمان ئەم ژمارەیە بگۆرین واتە فیلمە کە خێرا یان خاو بکەینەوە. ئەمەش لە وا نەکانی داهاتومان با سی ئەکەین کە لە چی کاتێك خێرایی فیلم زیاد بکرێت باشە و لە چی کاتێکیش کەم بکرێت.
دیسانەوە هەلبژاردنێکی تر هەیە(compress movie) کە لە وێنە 2 ئەیبینی ئەمەیان تەنیا لە وەشێنی 6 و 7 دا هەیە لەوانی تر نیە هەمو کاتێك ئەم چالاك بێت باشە، چونکە بەشێك لە فیلمە ئەپەستێنێت و نایەلێت زۆر قەبارەی فیلمەکە گەورە بێت.
لە بەشی ڕاستی وێنەی ژمارە 1 ئەبینی کە بە هێلی سەوز ڕەنگم کردووە، ئەمەیان وەکو ئەزانین و روونە بەکار دێت بۆ هەلبژاردنی رەنگەکان.
کۆتایی.
لەگەل ڕێزی براتا (ئالان علی )
ئەگەر پێویستت بە هەرجۆرە زانیاریەکی پەیوندیدار هەیە، بە خۆشحالّیەوە دەتوانی پەیوەدنیم پێوە بکەیت.

ئەرشیفی بابەتەكانی فێرگەی هەموو بۆ كوردان

**جووڵانەوەی ئەستێرەكان, Flash MX.**

نووسەر: :@

هەر وەكو بڕیار وابوو بابەتی دووەممان تایبەت بێت بە دروست كردنی ئەستێرەیەك كە بە دەوری ئەستێرەیەكی تردا دەخولێتەوە ، بەلام ئەزانن ئەو وانەیەم دواخست ئەویش لەبەر ئەوەی وانەی دووەمم تایبەت كرد بە تیشك خستنە سەر بەرنامەی فلاش و رێگەو هۆیەكانی بەكارهێنانی و چەند شتێكی تر.
جا لێرەدا دێینە سەر وانەی سێیەممان.
هەروەكو لە وانەی یەكەمدا باسی ئەوەم كرد كە ئەبێت بۆ جێ بەجێ كردنو تێگەیشتنی وانەكانی داهاتوو ئەبێت زۆر بە باشی وانەی یەكەم بخوێنیتەوە لێی تێ بگەیت.
هەر لەوێشدا ئاماژەم بەوە كردوە كە وانەی سێیەم بە تەواوی پشت دەبەستێت بە وانەی یەكەمەوە.چونكە ئەمیش هەر بەكار هێنانی رێرەوی جولانە لە فلاشدا بەلام ئەوەی ئەمێنێتەوە بیری خۆتو دەست رەنگینی خۆتە.
لێرەدا وێنەی ئاسمانمان هەیە كە گۆی زەویمان لێوە دیارە. ئێمە ئەمانەوێت كارێكی وا بكەین كە دیمەنی ئەستێرەیەك دروست بكەین بە دەوری زەویدا بخولێتەوە بەبێ ئەوەی بینەر هەست بەوە بكات كە ئەم شتە لە ناو ستودیۆ یان بە كۆمپیوتەر دروست كراوە ئەمەش یەكێكە لە گەورەترین هۆكاری كە سینەماكاران پشتی پێ ئەبەستن بۆ دروست كردن و پیشان دانی وێنەی ئاسمان یان هەر دیمەنێكی تری لەم بابەتە.
ئێستا كاتی ئەوە هاتوە قۆلی لێ هەڵمالیت و دەست بكەیت بە كار.



1- وێنەی ژمارە (1) دابەزێنە بۆ ناو كۆمپیوتەری خۆت كە بریتیە لە وێنەی ئاسمان و گۆی زەوی .
2- لە(layer1) و (frame 1)كرتە بكە پاشان لەرێگەی (import) وێنەكە راكێشە ناو بەرنامەی (فلاش). ئەلبەتە ئەبێت درێژی و پانی شوێنی كارەكەمان (400×550) بێت كاتێكیش وێنەكە دەهێنیت درێژی و پانی وێنەكەم بۆ كردویت بە نزیكەی درێژی و پانی شوێنی كاركەت.
3- لە كیبۆردەكە پەنجە بنێ بە (f8) وێنە بگۆرە بۆ ( movie clip). لە هەمان چین بچۆرە سەر (frame) ژمارە (150) لەوێدا لەسەر كیبۆردەكەت پەنجە بنێ بە (f6) ئەبینی درێژ بوونەوەیەك روو ئەدات لە (frame) ژمارە (1) هەتا (150)
4- لە چینی یەكەم واتە لە (layer1) ی یەكەم تەواو بویت چینێكی تر زیاد ئەكەین. كە ئەبێتە (layer2)لەوێشدا لە (frame) ژمارە (1) داكرتە بكە و وێنەی بازنەیەكی بچوك دروست بكە. لێرەدكا كارەكانمان وەكو كاری وانەی یەكەمی لێ دێت چەند جیاوازیەكی كەم هەیە ئەوانیش باس ئەكەین.




سەیری وێنە ژمارە (2)بکە.دوای ئەوەی وێنەکەت دروست کرد تێبینی ئەوە ئەکەیت کە ئەویش بە شێوەی خۆ کرد لە (frame) ژمارە (1)ەوە درێژ بوو تا ئەگاتە (150) واتە شان بەشانی ئەوەی یەکەم. ئەویش کارێکمان بۆ کەم ئەکاتەوە, من لە وێنە(2)دا ڕەنگی بازنەکەم بە سۆر کردوە بۆ ئەوەی بتوانیت بیبینیت، ئەگەر بە ووردی سەیری شوێنی وێنەی بازنەکە بکەیت دەبینی کە هەولم داوە لەسەر هێڵی تەوەری زەوی کردومە ئەمەش لە دووابیدا یارمەتیمان دەدات بۆ ئاسانی دیاری کردنی ڕێرەوی بازنەکە.
ئێستا وەکو وانەی یەکەمکرتەی ڕاست ئەکەین لەسەر چینی دووەم و (add mation guide) هەل ئەبژێرین سەیر ئەکەین هەر ئەوەمان هەلبژارد چینێکی تر زیاد ئەبێت لە سەرەوە ئەوەیان ئەبێتە چینی هێڵەکە کە دەی کێشین بۆ دیار کردنی ڕێرەوی بازنەکە.
وا چاکە ئەگەر دووچاری گرفت بوویت چاوێك بە وانەی یەکەمدا بخشێنیتەوە چونکە لەوێدا زۆر بە ووردی هەموو قۆناغەکانم ڕوون کردۆتەوە.
5-ئێستا ئەچینە سەر چینی سێیەم چینی (guide) لە خالی یەکەم واتە لە (frame1)کرتە ئەکەین و پێنوس (قلم ) هەل ئەبژێرین بۆ کێشانی هێڵی ڕێبەری سەیری وێنە 3 بکە.




ئەوەی لێرەدا زۆر گرنگە ئەوەیە کە ئەبێت ئەو هێڵەی کە کێشاومانە کەوانەیی بێت (نارێکی) تیا نەبێت وەکو ئەو هێڵە بێت کە لە وێنەی (3) دەیبینن. چونکە ئەگەر هێڵەکە راست نەبێت ئەوا بازنەکەش واتە ئەستێرەکەش بە نارێکی بەسەریدا دەڕوات ئەمەش وا دەکات کە بینەر هەست بە ناشرینی دیمەنەکە بکات.
جا بۆ ڕێك خستنی هێڵەکە دیسانەوە سەیری وێنە ژمارە (3)بکە بە هێڵی سوور نیشانەم بۆ کردوە کە ئەمانە بۆ ڕێکخستنی هێڵەکانە. جا تۆ کاتێك ئەتەوێت ڕێکی بخەیت ئەوا هێڵەکە نیشان بکە(select) بکە پاشان کرتە لەسەر یەکێك لەوانە بکە تاکو هێڵەکە بە دڵی خۆت ڕێك ئەخەیت.
**بۆ بینینی نموونەی کاری ئەم بابەتە کرتەیەک لێرە بکە.**
تێبینینی // کاتێك سەیری (نمونەی کاری ئەم بابەتە) ئەکەیت لە کۆتایی دا چەند شتێك ئەبینیت لەوانە ووشەی(ئارا مت بیت) ووشەی (بارکراو) و(ڕێژە) ئەم کارە زۆر کارێکی گرنگە بەلام کاتێك تۆ فیلمەکەی خۆت دروست ئەکەیت ئەمەی تیا نابێت کە من لێرە بۆم داناوە، ئەوە پێی ئەڵێن (preloading) یان(preloader).... بۆچی بەکار دێت؟
زۆر جار ئێمە کاتێك سەردانی ماڵپەڕێك دەکەین ئەبێت ماوەیەکی زۆر چاوەڕوان بین ڕەنگە جاری وا هەیە هەر نابێتەوە یان ئەگەر بشبێتەوە نازانین چەندی ماوە تاکو ببێتەوە خولاسە دوچاری دڵە ڕاوکێ دەبین, بەلام بەرنامەی فلاش ئەم گرفتەی بە جوانترین شێوە چارەسەر کردوە ئەویش وەکو گوتمان پێی ئەڵێن (preloader).
سەیر ئەکەیت کاتێك ئەتەوێت ئەم نمونە کارەی من ببینیت هیچ دوچاری دڵە ڕاوکێ نابیت چونکە ئەزانی چەندی ماوە تاکو ببێتەوە نووسراوە کۆی گشتی بایت یەکسانە بە (---) وە ئەوەی کە بارکراوە یەکسانە (---) بۆ نمونە, وە لە هەمووشی گرنگتر ڕێژەی سەدیە (%) کە ئەبینیت شریتەکە لە گەڵیدا ئەجوڵێت هەتا لە تەواوبوون نزیك بێتەوە شریتەکەش درێژ تر ئەبێت.
هەر کاتێك ڕێژە کە بگاتە (100%) ئەوا فیملی ئەسڵی فلاشەکەمان دەست بە کار کردن دەکات.بەلام دیاردەی (preloader) گەر کاتمان هەبوو ئێوەش لەگەڵمان بەردەوام بن ئەوا لە چەند وانەیەکدا باسی دەکەین چونکە بابەتێکی تۆزیك تێك هەڵکێش و ئاڵۆزە بۆیە لە چەند وانەیەکدا هەوڵ ئەدەم باسی بکەم.

تێبینی // دوباره سەیر ئەکەیت لە فیلمەکەی من دروستم کردوە ئەستێرەکە تاکو نزیك بێتەوە گەورە ئەبێت بەلام لەوەی تۆدا ئەم شتە نابینیت. ئەمیان زۆر ئاسانە تۆش ئەتوانی ئەم کارە بکەیت بڕۆ چینی دووەم بەلام ناوەراستی چینی دووەم واتە (frame 75) خالی ژمارە (75) لە وێدا لە کیبۆردەکەت پەنجە بنێ بە (f6) تاکو تیرەکە کەرت بێت، هەر لە شوێنی خۆی ئەچیت وێنەی بازنەکە تۆزێك گەورە ئەکەیت بەس ئەوەندە ئیتر کاتێك فیلمەکە تاقی دەکەیتەوە ئەبینی ئەستێرەکە هەتا نزیك بێتەوە گەورە ئەبێت هەتاکو خالی(75) , بەلام کە لەو خالە رەت بوو ئیتر دەست ئەکات بە بچوك بوونەوە.

هەر ئەم کارەی کە لەم دوو وانەیەدا گەر تێی گەیشتی وجێ بە جێت کردبێت ئەوا هەنگاوی زۆر باشت ناوە بۆ فێر بوونی فلاش ام اکس وە ئەتوانی هەر بەم قوناغانەدا کە باسمان کرد چەندەها ئەستێرەی تر دروست بکەیت بە دوری زەویدا بسورێنەوە بە شێوەی زۆر جوان و سەرنج راکێش .

لە کۆتاییدا دەست بنێ بە (ctrl+Enter) فیلمەکەی خۆت ئەبینیت

چاوەروانی بابەتەکانی داهاتوو بن!

ئەتوانی هەر چی تێبینی یان پرسیارێکت هەیە رەوانەی بکەیت بۆ من و هەوڵ ئەدەم بە زووترین کات وەڵامت بدەمەوە.

Oct 2005 31

ئەرشیفی بابەتەکانی فێرگەی هەموو بۆ کوردان

## ڕێبەری جووڵان لە Flash MX

نووسەر: @:

لەگەڵ نووسین و بڵاوکردنەوەی یەکەم بابەتم سەبارەت بە Flash MX پێم باشە بە خوێنەران و بەکارهێنەرانی ئەو پرۆگرامە ڕابگەیەنم کە هەوڵ ئەدەم و بە پێی توانام لە وێبگەی هەموو بۆ کوردان دا زنجیرە بابەتێکی هەمان پرۆگرام بڵاو بکەمەوە. هیوادارم هەموو کارەکان وەک چاوەڕوانکراو بەرەو پێشەوە بچن.

یەکەم بابەت لە فلاش دەربارەی ڕێڕەوی جولانی شتێك ئەبێت کە خۆت بۆی دیاری ئەکەی کە پێی دەوترێت (mation guide).

1- بەرنامەی Flash MX بکەوە، پەڕگەیەکی نوێ بکەوە کە درێژی و پانیەکەی (400×550) بێت.

2- لە Time Line دا بڕۆ سەر Frame ـی یەکەم وەکو وێنەی ژمارە (1) . یەك کرتەی لەسەر بکە.




3- وێنەیەك دروست ئەکەین وەکو بازنەیەك ( یان هەر شتێکی تر) لە ناوچەی خوارەوە واتە لە (شوێنی کار)، وەکو وێنەی ژمارە(2) .




4- یەك كرتە لەسەر بازنەكە ئەكەین بۆ ئەوەی بازنەكە دیاری بكەین (select), یان هەر ئەتوانی بێ ئەوەی كلیك لەسەر بازنە كە بكەیت، ئەتوانی تەنیا كلیك لەسەر Frame یەكەم بكەیت ئەو كاتە خۆی بازنە كە د یاری دەكات، چونكە Frame ــی یە كەم تەنیا بازنەكەی تیایە.

سەیری وێنەی ژمارە (3) بكە كاتێك بازنەكە select ئەبێت دەبینی كە خالی وورد وورد ئەكەوێتە ناو بازنەكە ئەوە نیشانەی ئەوەی كە بازنەكە دیاری بوو واتە select بووە.

5- دوای ئەوەی بازنەكەمان دیاری كرد پەنجە ئەنێین بە f8 بازنەكە ئەگۆڕین بۆ ( movie clip).

وەكو وێنەی ژمارە 3. پاشان ok ئەكەین.




6- ئەچینەوە سەر Time Line و Frame ی یەکەم لەسەر Frame ـی یەکەم کرتەی لای ڕاست ئەکەین و (create mation tween) هەڵئەبژێرین کە یەکەم دانەیە لە کاتی دەرکەوتنی کرتەی لای ڕاست.
سەیری وێنەی (4) بکە.




7- دوای ئەوەی خاڵی (6) جێ بەجێ کرا . لە هەمان شوێن واتە لە Frame ـی یەکەم دووبارە کرتەی ڕاست ئەکەینەوە ئەم جارەیان ئەو Frame ـە واتە Frame ـی یەکەم ڕوونووس/ کووپی ئەکەین (copy frames).
8- ئەچینە سەر Frame ـی ژمارە 50 لەوێدا کرتەی لای ڕاست ئەکەین , بۆ ئەوەی ئەو شتەی لە Frame ـی یەکەم ڕوونووسمان کرد لە Frame ـی ژمارە 50دا دەیلکێنین ( paste frames ).

کاتێك کرداری paste مان کرد ئەبینین Time Line وەکو وێنەی ژمارە 5ی لی دێت ئەبێتە تیرێك سەرەتاکەی لە Frame ـی یەکەم ئەبێت و کۆتایشی لە Frame ـی 50 ئەبێت.




9- ئەچینیە سەر Layer / چین وەکو لە وێنەی (6) ڕوونە کرتەی لای ڕاست ئەکەین و (add mation guide) هەڵئەبژێرین.




دوای ئەوەی کرتەمان کرد لەسەر(add mation guide) یەکەسەر چینێک (layer) لە سەرەوە زۆر ئەبیت.
وەکو وێنەی ژمارە (7) ی لێ دێت کە بە هێلی سوور دیاری کراوە.




بەڵام ئەبێت بزانین کە ئەوەیان چین نیە بەتەنیا، ئەوە پێی ئەوترێت چینی ڕێنماییی کەر(guide layer) واتە لەوێدا ئەتوانی ڕێنمانیی ئەو بازنەیە بکەی بە ئارەزووی خۆت بۆ هەر لایەك ڕەوانەی ئەکەی یان ئەیجووڵێنی.
تێبینی / کە باسی جووڵان ئەکەین بە ئارەزووی خۆت , ئەبێت هێلێك بکێشیت بە ئامرازی پێنووس (قەلەم) تاوەکو بازنەکە ئەو هێڵە

بەکار بهێنێت کە تۆ کێشاوتە بۆ ئەوەی بە سەریا بڕوات. کەواتە ئەو هێڵەی تۆ دەیکێشی ئەبێتە ڕێڕەوی ئەو بازنەیە ئەمەش گرنگیەکی زۆر زۆری هەیە.

بۆ جووڵاندنی شتەکان, لە بابەتی داهاتوودا باسی درووست کردنی ئاسمان ئەکەین کە چەند ئەستێرەیەك بە دەوری زەویدا یان بە دەوری یەکتردا ئەخولێنەوە.هەر یەکیان لەسەر ڕێڕەوی خۆی.

کە ئەویش بە هۆی ئەم بابەتەی ئەمرۆمانەوە ئەکرێت جا تکایە زۆر بە باشی لە بابەتی ئەمرۆ وردە کاری بکە تاکو بتوانیت شتەکانی دوایی بە باشی تێ بگەیت.

ئێستا دێینە سە رچینی دوەم واتە (guide layer) لە Frame ـی یەکەمی Guide Layer کرتە ئەکەین.

10- لە tools واتە ئامزارەکان ئەچینە سەر پێنووس (قەلەم) کە لە خوارەوەی بازنەکەدایە.

11- دوای ئەوەی پێنووسمان کرتە کرد ئیتر دێینە سەر گۆرەپانی کارە کەمان هێڵێك بە ئارەزووی خۆمان ئەکێشین لە سەرەوە بۆ خوارەوە لە خوارەوە بۆ لای ڕاست.

لە لای راست بۆ چەپ (ئاگاداربە ئەمە هەمووی لە guide layer ) دوای ئەوەی هێڵەکەت تەواو کرد دەست لە مشکی کۆمپیوتەر بەردە، ئەبینی هەر کە دەست لە ماوسەکە هەڵگرت دەستبەجێ بازنەکە خۆی بە شێوەیەکی خۆکار دێتە سەر سەرەتای هێڵەکە سەیری وێنەی ژمارە (8) بکە.

ئەگەریش خۆی نە هاتە سەر هێلەکە ئەوا ئەبێت ئەم هەنگاوانەی خوارەوە بنێیت ( بەلام بە بۆچونی من گەر بازنەکە بە شێوەیەکی خۆکار هات یان نەهات ئەوا تۆ واچاکە ئەم هەنگاوانەی خۆت هەر بنێیت باشترە).




#

ئێستا لە guide layer تەواو بوین دێینەوە سەرتیرەکە واتە چینی یەکەم لە Frame ـی ژمارە (1) دا یەك کرتە ئەکەین ئەبینین بازنەکە دیاری ئەبێت (select) ئەبێت چونکە وەکو لەوە پێش باسمان کرد Frame ـی یەکەم لە لایەری یەکەم تەنیا بازنەکەی تیایە. هەر لە وێدا بازنەکە بە مشکەکە رادەکێشینە سەرەتای هێلەکەی کە کێشاومانە. بەڵام بە مەرجێك ئەو خالەی لە نێوەڕاستی بازنەکەدا هەیە بکەوێتە سەرەتای هێلەکە (سەیری وێنەی ژمارە (4) بکەرەوە ئەو خالە ئەبینی کە لە نێوەڕاستی بازنەکەدا هەیە).

ئەمجارەیان ئەچینە Frame ـی ژمارە (50) لە چینی یەکەم واتە کۆتایی تیرە کە لەوێشدا تەنیا یەك کرتە ئەکەین . بەڵام لێرەدا بازنەکە ڕادەکێشین بۆ کۆتایی هێڵەکەی کە کێشاومانە.

به هه‌مان شێوه ئه‌بێت ئه‌و خاڵه‌ی له‌ نێوه‌ڕاستی بازنه‌که‌دا هه‌یه‌ بکه‌وێته‌ کوتایی هێڵه‌که‌ .
لێره‌دا کاره‌که‌مان کۆتایی پێ دێت ئه‌وه‌ی له‌ سه‌رمان ئه‌مێنێت ته‌نیا په‌نجه‌ بنێین به‌ ( Ctrl+Ebter ) بۆ ئه‌وه‌ی دیمه‌نه‌که‌ی ببینیت.
تێبینی/ ئه‌و هێڵه‌ی که‌ کێشاومانه‌ له‌ فیلمه‌که‌دا ده‌رناکه‌وێت به‌لکو ته‌نیا بۆ ئه‌وه‌یه‌ که‌ ڕێنمایی بازنه‌که‌ی پێ بکه‌ین بازنه‌که‌ به‌ سه‌ریدا بروات.
بابه‌ته‌که‌ زۆر ئاسانه‌، هه‌وڵم دا هه‌ندێک وێنه‌ی تێدا به‌کار ببه‌م و به‌ شێوه‌یه‌کی ساکار ڕوونی بکه‌مه‌وه‌، بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و که‌سانه‌ی که‌ له‌ Flash MX نازانن خۆیان بێبه‌ش نه‌زانن و ئه‌وانیش سوود له‌و بابه‌ته‌ ببینن.
بۆ بینینی نموونه‌ی کاری ئه‌م بابه‌ته‌ کرته‌یه‌ک لێره‌ بکه‌.
کۆتایی.
هیوادارم بابه‌ته‌که‌ سوودی هه‌بێت و چاوه‌ڕوانی بابه‌ته‌کانی دیکه‌ی ئه‌م زنجیره‌ بابه‌تانه‌ بن.

Oct 2005 31

ئەرشیفی بابەتەکانی فێرگەی هەموو بۆ کوردان

**جووڵانەوە لە Flash MX.**

نووسەر: Kurdo
@: Kurdboy70@Hotmail.Com

بابەت: ئانیمەیشن کردن لە بەرنامەی فلاش، ئەو بابەتە بریتی یە لە دروست کردنی فلیمێک بە بەرنامەی Flash MX ، کە بریتی یە لە چەند ژمارەیەک کە لە ژمارە 10 یەوە بەرەو خوارەوە دەچێت بۆ ژمارە 1، گرینگ ئەوە ئێمەی کوردیش ئاشنایی پەیدەبکەین لەگەڵ ئەو بەرنامە جوانە کە شتی زۆر جوانی پێ دەکرێت.



سەرەتا تەزدەکەم بەکورتی تیشکێک بخەمە سەر پێکهاتەکانی بەرنامەکە.




بەشی Tool کە بریتی یە لە بەشی ئامرازەکان، لە بەشە دەتوانی ئامرازێک هەڵبژێری وێنەو نووسین و شتی تری پێ بکەی،




Timeline بەکاردێت بۆ دانانی مەوداو کات بۆ وێنەکەت، ئەو بەشە زۆر گرینگە




بەشی Palet لە بەشە زۆر شتی تری تێ دایە بۆنموونە Color mix کە بەکاردێت بۆ گۆڕینی ڕەنگی دووگمەو تێکست و شتی تر، وە زۆر سیفەتی تر لە خۆ دەگرێت.




لەبەشی Properties دەتوانی بۆ نموونە قەبارەی لاپەڕەکەو ڕەنگی دواوەی بگۆڕی، هەروەها نموونەیەکی تریش لەکاتی نووسین دەتوانی لەم بەشە قەبارە و ڕەنگ و فۆنی نووسینەکە بگۆڕی.

ئەمە زۆر بەکورتی باسێکم خستە سەر پێکهاتەکانی بەرنامەکە.

هەنگاوی دروست کردنی فیلمەکە.

ئێستا بڕۆ بەرنامەی Flash MX بکەوە.

بەنچەرەیەکی وات بۆ دێت.




تۆ Flash Document هەڵبژێرە تاکوو پەڕێکی تازەمان بۆ بێت. گەر ئەو پەنچەرەی نەدابوو دەتوانی لە File / New هەڵبیبژێری.

ئێستا لە دوای ئەنجام دانی هەنگاوەکانی سەرەوە، لە بەشی ئامرازەکان Tool دا، Text Tool هەڵبژێرە، برۆ لەناوەڕاستی پەڕە سپی یەکە چوارگۆشەیەک بکێشە لەناوی دا ژمارە 10 بنووسە سەیری خوارەوە بکە لە بەشی Properties دەتوانی فۆنت و قەبارەی نووسینەکە و ڕەنگی نووسینەکەت بگۆری.

ئێستا دوای ئەنجام دانی ئەو هەنگاوەی سەرەوە دەبێت وەک ئەو وێنەیە بێت.




TimeLine، ئەوبەشە پێک دێت لە Frame. لەو وێنەی سەرەوە دەبینین لە چینی Layer 1 لە ژێر ژمارەی 1 خانەێک دیاری کراوە بەرِنگی رەش وە بازنەیەکی سپی تێدایە. ئەوە پێی دەڵێن Frame.

ئیستا تۆ برۆ بە مشکی کۆمپیتەرەکەت Frame 2 دیاری بکە لە تەنیشت فرێمی یەکەم وەک ئەو وێنەیە،




پاشان کلیک بکە سەر F6، دەبینین فرێمێکی تازە درووست دەبێت، ئێستا Frame 2 دیاری بکە بە ئامرازی نووسین Text Tool لە ناوەڕاستی پەڕەکە ژمارە نۆ بنووسە بە هەمان فۆنت و قەبارە.




ئێستا بڕۆ کلیک بکە سەر فریمی دووەم کە ژمارەی نۆمان تێدا نووسی دیاری بکەو کلیکی ڕاست بکە سەر هەندێ خیارەت دەداتێ تۆ Copy Frames هەڵبژێرە.

بڕۆ فریمی سێ یەم تەنیشت دووەم هەڵبژێرە دیاری بکە کلیکی ڕاست بکە ئەمجارە ئەوە هەڵبژێرە، Paste Frames دەبینین ناوەڕۆکی فریمی دووەم هاتووە ناو ئەو فریمەی کەتازە دروستمان کردووە، ئێستا بە ئامرازی Text Tool دووجار کلیک بکە سەر ژمارە نۆ دەبینین دەتوانین بیگۆڕین ژمارە 9 بکە بە 8 . هەمان هەنگاو دووبارە بکەوە لەگەڵ ژمارەکانی تر 1،2،3،4،5،6،7 .

ئەنجامی کۆتای دەبێت وەک ئەو وێنەیە بێت.




ئێستا کارەکەمان تەواو کرد، دەمانەوێت فلیمەکە تاقی بکەینەوە بزانین چۆنە.
لە بەشی سەرەوە Control کلیک بکە پاشان Test Movie هەڵبژێرە. یان Ctrl+Enter کلیک بکە.
دەبینین پەنجەرەیەک دێت کە فلیمەکەمان تێدا پیشاندەدات.

نموونەی کاری ئەم بابەتە.
بە هیوای ئەوەی کە سوودی هەبووبێ.

Nov 2005 10

ئەرشیفی بابەتەکانی فێرگەی هەموو بۆ کوردان

**جووڵانەوە لە FlashMX، بەشی یەکەم.**

نووسەر : Kurdo

@: Kurdboy70@Hotmail.Com

جووڵانەوە لە فلاش، لەم بابەتە دا تیشک دەخەمە سەرچەند کردارێکی گرینگ کە بەو بەرنامە جوانە دەکرێت، بۆ نموونە کرداری ماسک کردن(Mask)، وە کرداری (Shapebetween)، وە (Motion Between)، و دروست کردینی سومبول و ڕاکێشانی وێنە بۆ ناو فلاش، وە زۆر شتی تر...

فلیمی ئەم جارەمان بریتی یە لە وێنەیەک کە بەهۆی چینی ماسکەوە چەند هەنگاوێکی جوان بۆ وێنەکە دروست دەکەین. پاشان پەپولەیەک بە کرداری Add Motion Guide وای لێ دەکەین کە بە ناو وێنەکە بفرێت.

ئێستا برۆ بەرنامەی فلاش بکەوە پەڕێکی نوێ بکەوە.




ئێستادوایی ئەنجام دانی ئەم کارەی سەرەوە

دەبینین پەڕێکی سپی کراتەوە ئەم پەرە پێ ی دەوترێت Stage، گەر تەماشای بەشی Timeline بکەین کە لەسەرەوەی پەرەسپی یەکەیە. دەبینین یەک چین هەیە بە نێوی layer 1 . ئێستا دەبێت چینێکی تری بۆ زیاد بکەین. ئەوەش بەم شێوەیە دەبێت، تۆ دەبێت چینی layer 1 دیاری بکە.




وەک لە وێنەکە دیارە. کلیک بکە سەر ئاکۆنی زیادکردنی چین بۆ زیاد کردنی چینی دووەم، ئێستا دەبێت دوو چین هەبێت layer 1 وە Layer 2 .

من دەمەوێتئەمدوو چینە بکەم بە ماسک .




وەک لە وێنەکە دەردەکەوێت، کلیک ڕاست بکە سەر Layer 2 پاشان Mask هەڵبژێرە، ئێستا چینی Layer 2 دەبێت بە Mask layer وە چینی layer 1 دەبێت بە masked layer .




تۆش وەک من چینەکان ناویان لێ بنێ، دەبێت کلیک بکە سەر ناونیشانی چینکە کە Layer 2 ە، دەبینین دەتوانین ووشەی Layer 2 بسڕینەوە لە شوێنی بنووسە Mask layer ، پاشان کلیک بکە سەر Enter لەسەر کیبۆردەکەت، دەبینرێت ناوەکە گۆڕا، بە هەمان شێوە چینی layer 1 بگۆڕە بۆ masked layer.
لە تەنیشت چینەکان وێنەی قوفڵێک هەیە، ئەوە ئەوە دەگەیێنێت کە ئەم چینە قوفول دراوە ناتوانی هیچ گۆڕان کاری یەک تێدا بکەیت. بۆ یە ئێستا لە چینی masked layer یەک جار کلیک بکە سەر قوفلەکە دەبینین لادەچێت، ما نای ئەوە دەتوانین بە کەیفی خۆمان چینەکە دەست کاری بکەین.
ئێستا لە لیستی Timeline دەبێت ماوەی کاتەکە درێژتر بکرێت، گەر سرنج بدەینە هەردوو چینەکە دەبینین، هەردووکیان بەس یەک فرێمان هەیە کە بریتی یە لە Frame 1 ئێستا دەبێت فرێمی هەردووکیان درێژتر بکەین بۆ Frame 25, بە میشکی کۆمپیتەرەکەت، کلیک چەپ بکە سەر Frame 25 وە پەنجەت بهێڵە لەسەر وا تە ڕایگرە وە لە هەمان کاتدا ڕایکێشە خوارەوە بۆ ئەوەی هەردوو فرێمی چینەکان بەیەک کات دایری بکرێن کاتێک هەردوو فرێمی 25 ی چینەکان دیاریت کردن،




پەنجە بنێ بە F5 لەسەر کیبۆردەکەت.




من لە چینی masked layer وێنەی باکگراوەند دەدەنێم، تۆ دەبێت لە پێشەکی وێنەیەکت ئامادەکردبێت بۆ باکگراوەندەکە. ئێستا چینی masked layer دیاری بکە، پاشان کلیک بکە سەر File/Import/Importtostage. کلیک بکە




پاشان پەنجەرەیەکی ترت بۆ دێت لەوێ دا وێنەکە بدۆزەوە، کلیک بکە سەر Open بۆ هێنانی وێنەکە بۆ ناو Stage.

بە ئامرازی Selection Tool یەک جار کلیک بکە سەر ئەو وێنەی کە تازە گواستمانەوە بۆ ناو چینی masked layer بۆ دیاری کردینی، ئێستا دەمەنەوێت وێنەکە بگۆڕین بۆ گرووپ، باشە وێنەکەمان د یاری کردووە، بۆ گۆڕینی وێنە بۆ گرووپ کلیک بکە سەر Ctrl+G یان..




ئیش مان بە چینی masked layer نەما، بۆ یە کلیک بکە سەر قوفلەکە بۆ ئەوەی ئەم چینە قوفل بدرێت، بۆ ئەوەی کاتێک لە چینەکانی تر ئیش مان کرد با بە هەڵە دەست کاری ناوەڕۆکی ئەو چینە نەکەین.

ئێستا چینی Mask layer دیاری بکە وە قوفڵەکەی لەسەر لابەرە.
بە ئامرازی Oval Tool لە ناوەڕاستی وێنەی باگگراوەندەکە چەماوەیەک بکێشە.



دەتوانی بە ئامرازی Selection Tool شوێنی چەماوەکە بگۆڕی وە بە ئامرازی Free Transform Tool دەتوانی قەبارەی چەماوەکە گەورەو بچووکی بکەی.
ئێستا دەبێت لە چینی Mask layer لە Frame 8 دا KeyFrame زیادبکەین، باشە برۆ Frame 8 دیاری بکە پاشان کلیک بکە سەر F6 لەسەر کیبۆردەکەت یان، کلیکی ڕاست بکە سەر Frame 8 پاشان Insert Keyframe ...



بەهەمان شێوە Keyframe بۆ Frame 17 و Frame 25 زیادبکە.
پاشان Frame 8 دیاری بکە بە ئامرازی Free Transform Tool ، چەماوەکە هەندێک گەورەتر بکە .



پاشان Frame 17 دیاری بکە بە هەمان شێوە بە ئامرازی Free Transform Tool چەماوەکە گەورەتر بکە.
پاشان دواترین فریم دیاری بکە کە Frame 25 ە، بە هەمان شێوە بە ئامرازی Free Transform Tool چەماوەکە زۆر گەورە بکە بە هەموو وێنەکەی باکگراوەند بشارێتەوە.
دەبێت Shapebetween لە نێوانیان دروست بکەین.
ئێستا لە نێوان Frame 1 و Frame 8 فرێمێک دیاری بکە لە نێوان 2 وە تاکو 7 ،پاشان لە خوارەوە لە بەشی Properties .
پەنچەرەیەکی بچووک هەیە لە تەنیشت Tween
لە ناو پەنچەرەکە Shape هەڵبژێرە.




دەبینین سەهمێک زیاد دەبێت لە فریمی 1 دەچێت بۆ فریمی 8 ، وە لە نێوانیان ڕەنگەکە گۆڕاوە بووتە بە ڕەنگێکی کەسکی کاڵ.
بە هەمان شێوە Shapebetween لە نێوان Frame 8 و Frame 17 و Frame 25 بکە.
ئێستا دوایی ئەنجام دانی ئەو هەنگاوەی سەرەوە دەبێت وەک ئەو وێنەیە لێ بێت.



ئێستا دەتوانی فلیمەکەت تاقی بکەیتەوە ، بۆ ئەم کردارە کلیک بکە سەر Ctrl+Enter
مەبەست لە دروست کردینی چینی ماسک ئەوەیە کاتێک وێنەکە دێت، چینی ماسکەکە وای لێ دەکات وەک پەردەیەک لە ڕووی وێنەکە ڕابماڵدرێت، ئەوەش جوانی یەک دەبەخشێت بە فلیمەکەت.
شایەنی باسە چینی ماسک زۆر گرینگە وە زۆر یش لە ماڵپەرەکان بەکاردێت دووگمەی زۆر جوانی پێ دروست دەکرێت.
بەشی دیکەش بەرێوەیە.

Nov 2005 18

ئەرشیفی بابەتەکانی فێرگەی هەموو بۆ کوردان

**جوولانەوە لە FlashMX, بەشی دووەم و کۆتایی.**

نووسەر : Kurdo
@: Kurdboy70@Hotmail.Com

ئەم بابەتە تەواوکەری بەشی یەکەمە کە لەبەشی FlashMX دا پێشتر بڵاوم کردۆتەوە.
لە بەشی دووەم دا باس لە دروست کردنی دوو کرداری نوێ دەکەم کە لەو بەرنامە جوانە دەکرێت. کرداری دروست کردنی هێڵێک کە پێی دەوترێت Add Motion Guide وە جووڵانەوی شتێک بە دەوری هێڵەکە، دووەم کرداریش دانانی کرداری Add motion.
ئێستا دەبێت لە سەر Masked layer and mask layer دوو چینی تر زیاد بکەین، بۆ ئەوە دەبێت layer 2 زیاد بکەین،




وە دەبێت چینی سێیەمی بۆ زیاد بکەین کە بریتی یە لە چینی Add Motion Guide ، بۆ ئەو هەنگاوەش، وەک وێنەکەی خوارەوە بۆی زیاد دەکەین.




ئێستا دەبێت ئەو سێ چینە نوێ یە کە زیادمان کرد فرێمەکانیان درێژتر بکەین، بۆ ئەو مەبەستەش کرتە بکە ژێر فرێمی 50 لە چینی Guide کاتێک کرتەت کردە سەر فرێمی 50 پەنجەت هەڵمەگرە بەهەر لەسەر بێت وە ماوسەکەت ڕاکێشە خوارەوە تاکو فرێمی 50 ی هەردوو چینەنوێ یەکەی کە پێش ئێستا درووستمان کرد لەگەڵ یەکتر بە یەکجار دیاری بکرێن،
پاش جێبەجێکردنی ئەو هەنگاوە، پەنجە بنێ بە دووگمەی F5 لەسەر تەختەکلیلی کۆمپیوتەرەکەت.




تۆ ئێستا وەک من چینی سێیەم ناو بنێ بە Background. ئێستا هەرسێ Frame 25 ی چینەکان دیاری بکە پاشان پەنجە بنی بە F6 دا. ئێستا برۆ بۆ چینی Masked layer کلیلەکە ناچالاك بکە / لای ببە، تاکو بتوانین ئیش لەنێو چینەکەدا بکەین.
بەئامرازی Selection Tool وێنەکە دیاری بکە ،




پاشان کرتەیەك بکە سەر وێنەکە بەلای ڕاستی مشکی کۆمپیوتەرەکەتدا، دواتر Copy کرتە بکە، تاکو وێنەکە ڕوونووس بکەین. ئێستا بڕۆ چینی Background وە فرێمی Frame 25 ی دیاری بکە، دەمانەوێت وێنەکە بخەینە هەمان شوێن لە چینی Background، بۆ ئەم مەبەستەش، بڕۆ Edit/ Paste in Place هەڵبژێرە،



دەبینین وێنەکە راستەوخۆ هاتووتە نێو چینی Background وە هەمان شوێن و قەبارەی هەیە کە لە چینی Masked layer دا هەیەتی. لەبەشی Palet دەبێت Library بکرێتەوە، ئەگەر نەبوو دەتوانی بە Ctrl + L و بیکەیتەوە. یان Window<< Library.
ئێستا دوای کردنەوەی Library ، دەبێت New Symbol دروست بکەین. Ctrl + F8 پەنجە بنێ یان Insert<< New symbol کرتە بکە.




دوایی جێبەجێکردنی ئەو هەنگاوەی سەرەوە پەنجەرەیەکت بۆ دێت وەک ئەوەی خوارەوە.




تۆش وەک من Graphic هەڵبژێرە، وەناوێکی لێ بنێ، من ناوم لێناوە Butterfly . پاشان Ok کرتە بکە. ئێستا گەر تەماشای Library بکەین دەبینین New symbol لەوێ زیاد بووە، بەو ناوەی کە تۆ ناوت ناوە، من ناو نابوو Butterfly. ئێستا گەر دووجار کرتە بکەینە سەر Butterfly لە ناوی بەشی Library دەبینین دەچینە پەرێکی نوێ، باشی یەکە لەوەدایە کە ئێمە هەردەم دەتوانین بچینە ناو New symbol ی Butterfly.
ئێستا من وێنەی پەپوولەیەك دەهێنمە نێو ئەو پەڕە سپییەی Butterfly. بۆ ئەم کارە دەتوانی لە File<< Import<< Import to Stage وێنە بهێنیە نێو پەڕە سپی یەکە. تێبینی: من وێنەی پەپوولەکە لە بەرنامەی Photo shop م دروست کردووە وە پاشان بەشێوەی جۆری PNG پاشەکەوتم کردووە، چونکە ئەو جۆرە تەنیا وێنەی پەپولەکە پاشەکەوت دەکات و پاشبنەماکەی نابینرێت.
وێنەی پاشبنەماکە زۆر جار سپی یە دیارنابێت. دەرهێنانی وێنە لە فۆتۆشۆپ زۆر ئاسانە بەم زووانە لەمەر ئەو بابەتە، بابەتێک دەنووسم. هەمان هەنگاویش دەرهێنانی وێنەو هەڵگرتنی بە شێوەی PNG لە بەرنامەی Fireworks دەکرێت. دەتوانی وێنەی پەپولەکە لێرە دایگری:



دوای هاتنی پەپوولەکە بۆ ناو پەڕە سپییەکە، بە ئامرازی Selection Tool دیاری بکە پاشان پەنجە بنێ بە هەردوو دووگمەی Ctrl و G بۆ ئەوەی وێنەکە ببێتە Group. لە بەشی سەرەوەی Timeline فرێمەکە درێژ دەکەین بۆ فرێمی 12 وە لە هەمان کات دا Keyframe بۆ زیاد دەکەین هەروەها لە فرێمی یەکەمیش Keyframe وە لەنێوانیشیان دوو Keyframe تر زیاد دەکەین. وە لەنێوان Keyframe مەکانیش Motion لە نێوانیان دەکەین.




ئێستا بە ئامرازی Free Transform tool لە شوێنی Keyframe ـەجیاوازەکان پەپوولەکە هەندێ بگۆرە بە پووچ کردن و گرژکرد ینی و لادانی کەمێک لە شوێنی خۆی. پاشان Keyframe ی یەکەم دیاری بکە وە وێنەکەش دیاری بکە برۆ لیستی Properties , لەوێ دا ژمارەی Loop بکە بە 10.




ئێستا Keyframe ـی دووەم دیاری بکە لەگەڵ وێنەکەش، من Keyframe ـی دووەم لە ژێر فرێمی 4 دایە ژمارەی Loop بکە بە 8، Keyframe ـەکانی تریش یەک بە یەک دیاری بکە ژمارەی کەم بکەوە وە دوایین Keyframe ژمارەی Loop بکە بە 1 ... هەنگاوی دروست کرینی پەپولەکە تەواو بوو، دەبێت بگەڕینەوە بۆ پەڕە سەرەکی یەکە، بۆ ئەنجام دانی ئەو هەنگاوە لە سەرەوەی Timeline کرتە لە Scene1 بکە.




دەبینین ڕاستەوخۆ دەگەڕێینەوە بۆ پەڕەی سەرەکی.

چینی پێنچەم ناو بنێ بە Butterfly. لەچینی Butterfly دا فرێمی 25 دیاری بکە Keyframe بۆی دابنێ لەم فرێمەدا، یانیش کاتێک فرێمی 25 دیاری کرد، پەنجە بنێ بە F6 لەسەر تەختەکلیلی کۆمپیوتەرەکەت. ئێستا فرێمی 25 دەبیت بەدیاری کراوی هەربمێنێتەوە، لەهەمان کاتدا تۆ لە بەشی Library دا Symbol Butterfly یەک جار کرتە بکە سەر و ڕای کێشە ناو Stage وە لە تەنیشتی قەراخی وێنە کە دایبنێ،




ئێستا لە تەنیشت فرێمی 25 واتە لە ژێر فرێمی 26، Keyframe ـی بۆ زیاد بکە، بۆ ئەو هەنگاوە فرێمی 26 دیاری بکە پاشان پەنجە بنێ F6 . ئێستا وێنەکە بە ئامرازی Selection Tool بیهێنە ناو وێنەی پاشبنەماکەوە،




گەڕێوە بۆ فرێمی 25 کە وێنەکە لەدەرەوەی وێنەی پاشبنەماکەیە، وێنەکە دیاری بکە بە ئامرازی Selection Tool. پاشان لە ژێرەوە لە بەشی Properties لە تەنیشت Color ئاسایی نوسراوە None تۆ بیگۆرە بۆ Alpha وە ڕێژەکەش بەکە بە 0%.




ئێستا هەموو بەشەکان دابخە/کلیلەکەی تەنیشتیان چالاك بکە، جگەلە بەشی Guide layer نەبێت جونکە ئێستا دەبێت کاری تێدابکەین.
مەبەست لە داخستنی بەشەکانی تر کاتێک ئێمە ئیش لە چینێک بکەین با بەهەڵە دەستکاری چینەکانی تر نەکەین بە بێ ویستی ئێمە. بە داخستنی ئەو چینانە ناتوانین دەستکاریان تێدابکەین.
لە چینی Guide layer بە ئامرازی Pencil Tool هێلێک بکێشە بەئارەزووی خۆت، کە پەپوولەکان بەدوای ئەو هێڵە بکەون و بەرێگە و شوێنیدا بفرن.



ئێستا ئەو چینەش دابخە، برۆ بۆ چینی Butterfly لە دواترین فرێم کە دەکاتە فرێمی Keyframe 50 دابنێ. پاشان فرێمی 26 دیاری بکە بە ئامرازی Selection Tool وێنەی پەپوولەکە دیاری بکە دەبینین لەناوەڕاستی وێنەکە چەمەوەیەکی بچووک هەیە دەبێت ئەو

چەماوە ڕابكێشرێت بۆ سەرەتای خاڵی دەستپێكردینی هێلەكە.ئەو هێلەی كە لە چینی Guide layer كێشامان.



دواترین فرێم دیاری بكە كە دەكاتە فرێمی 50 وە بەهەمان شێوە بە ئامرازی Selection Tool وینەكە دیاری بكە و وێنەكە ڕاكێشە دوایی خاڵی كۆتای هێلەكە بەمەرجێ چەماوە بچووكەكەی ناو وێنەكە بخرێتە سەر خاڵی كۆتایی هێلەكە.
دەبێت كرداری Motion لەنێوانیان دروست بكەین، بۆ ئەو هەنگاوەش، فرێمێك بە ئارەزووی خۆت لە نیوان فرێمی 26 تاكو 50 د یاری بكە وە لە خوارەوە لەبەشی Properties لە تەنیشت Tween دا Motion هەڵبژێرە، دەبینین لە نیوان فرێمی 26 تاكو 50 هێڵێك كێشراوە وە نیوانیشیان ڕنگێكی شینی كاڵ دەركەوتووە.
دوا هەنگاو كە دەبێت چینێكی تر لەسەرەوەی هەموویان زیادبكەین، كاتێك چینەكەمان زیاد كرد، ناوی دەنێین بە چینی Actions.




وەک وێنەکەی سەرەوە لە چینی Actions دا فرێمی 50 دیاری دەکەین، وە Keyframe ی لە فرێمی 50 بۆ دادەنێین، لەبەشی خوارەوە کرتە دەکەینەوە سەر Actions-Frame ، لەسەرەتایی پەڕە سپی یەکە دا ئەو کۆدە دەنووسین، stop(); دەبینین لە فرێمی 50 دا لە سەرەوەی چەماوە بچووکەدا پیتی a زیاد بووە، ئەوە مەبەست وایە کە لەم فرێمەدا کۆدی بۆ داندراوە، مەبەستیش لەدانانی ئەو کۆدە بریتی یە لە کاتێک فلیمەکە جارێک بە ئیش دەخەین کاتێک دەگاتە دواترین فرێم بەم کۆدە ڕاوەدەستێت، واتە هەنگاوەکان دووبارەنابێتەوە.
شایەنی باسە Actions script بەشێکی زۆر گەورەیە لە بەرنامەی فلاش، زۆر کرداری گرینگی پێ جێبەجێ دەکرێت.
لەبەستەری خوارەوەدا دەتوانی ئەنجامی وانەکە ببینی:

ئەنجام.

هەروەها دەتوانی پەڕگەی سەرچاوەی ئەم بابەتە دابگری و لە پرۆگرامی FlashMX دا بیکەیتەوە و لە نزیکترەوە ببینی کە هەنگاوەکان چۆن جێبەجێ کراون.

داگرتن / قەبارەی ١،٩٠ میگابایت.
کۆتایی.

Jan 2006 11